# مسمى





نوسینی : ابو عاهد
ئامادەکردنی : ابو بصیر الکوردي
تایپ و دیزاین : معاویة الکوردي

# مسمى الديار / زارەوەی ( وڵات – شوێن - جێگە - خاك )

إن الحمد لله نحمده ونستعينه ، ونعوذ بالله من شرور أنفسنا ومن سيئات أعمالنا من يهده الله فلا مضل ومن يضلل فلا هادي له ، وأشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له وأشهد أن محمدا عبده ورسوله صلى الله عليه وعلى آله وأصحابه وسلم تسليما كثيرا (يا أيها الناس اتقوا ربكم الذي خلقكم من نفس واحدة وخلق منها زوجها وبث منهما رجالا كثيرا ونساء واتقوا الله الذي تساءلون به والأرحام إن الله كان عليكم رقيبا) (يا أيها الذين اتقوا الله وقولوا قولا سديدا يصلح لكم أعمالكم ويغفر لكم ذنوبكم ومن يطع الله ورسوله فقد فاز فوزا عظيما)

**قاعد شرعی :** هه ر وڵاتێك ( دار ) حوكمەكەی بەبێ ئەو یاسایانە دەبێت كە دادوەری ( حوكم ) بێدەكرێت تێدا و باڵا دەستە بە سەریدا .

ئەگەر هاتوو یاساكانی إسلام شكۆدار و باڵا دەست بوو وە كاری پێكرا ئەوە بە وڵاتی إسلام هەژمار دەكرێت .

خۆ ئەگەر یاساكانی بێباوەری تێایدا ظالبوو ئیشی پێكرا ئەوە بە وڵاتی كوفر ئەژمار دەكرێت .

**پرسیاری یەكەم /** ئایا دروشم و دیاردەكانی مزگەوت و دیاردەكانی وەك حەج – زەكات و جگە لەمانەش لە هەر خاك یان وڵات و جێگەیەكدا هەبوون ئەوا ئەو شوێنە بە خاك و جێگەی إسلام هەژمار دەكرێت ؟

**وەڵام /** نەخێر هەروەك ئاماژەمان پێدا بەم دیار دانە دیاری ناكرێ بەڵكو بەبێ ئەو یاسایانە یە كە باڵا دەستە و دادوەری پێدەكرێت .

**پرسیاری دووەم /** ئایا ئەگەر لە وڵاتێكا بینیمان دانیشتوانەكەی تێكڕایان موسوڵمان بوو ئەوە بە وڵاتی إسلام دادەنرێت ؟

**وەڵام /** نەخێر بەڵگەش لەسەر ئەمە خاك و وڵاتی حەبەشەیە كە لە سەردەمی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) خەڵكەكەی موسووڵمان ببوون بەڵام بە یاسای إسلام دادوەری نەدەكرا تێدا هەتا ئەو كاتەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) نێردراوی ناردە لایان .

**پرسیاری سێ یەم /** ئایا ئەگەر بینیمان دانیشتوانی وڵاتێك زۆرینەیان بێباوەڕبوون (كفار) ئەو وڵاتە بە وڵاتی بێباوەڕان (كافر) دادەنرێت ؟

**وەڵام /** نەخێر لەبەر ئەوەی پێشتر ئاماژەمان پێكرد هەر وڵاتێك بەپی ێ ئەو یاسایانە دیاری دەكرێت كە باڵا دەستە تێدا بەڵگەش لەسەر ئەمە خاك و نیشتەجی طائفي سەردەمی پێغەمبەرە (صلى الله عليه وسلم) .

ئەگەر جی زۆرینەی دانیشتوانەكەی بێباوەڕبوون بەڵام بە یاسای إسلام دادوەری تێدا دەكرا .

لێرەدا ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە كە شوێن و جێگەی پەرستنەكان ( مزگەوت ) وە دانیشتوانی هەر وڵاتێك بەڵگەنین لەسەر ناسین و دیاری كردنی (حوكم )ی ئە و خاك و وڵاتە .

**قائدە شرعی /** جۆری دیاری كردنی هەر وڵاتێك تەنها دوو جۆری هەیە و سێهەمی نییە .

مەبەست لەوەیەیان دار السلام یان دار الكفر .

بەڵگەش لەسەر ئەم بنەما شەرعیە الله ی گەورە لە سورە تی ( الأعراف : 145 ) دەفەرمووێت:
سَأُرِيكُمْ دَارَ الْفَاسِقِينَ ( ١٤٥ ).

**واتە /** بە زووی جێگە و شوێنی لە سنوور دەرچوانتان نشان دەدەم .

ابن القيم ( رحمه الله ) دەفەرمووێت : هەروەك چۆن فاسقین لە سنوور دەرچوان ( بێباوەڕان ) شوێن و جێگەیان هەیە باوەڕدارانیش شوێن و جێگەیان هەیە .

شێخی الإسلام إبن تيمية ( رحمه الله ) بۆ چونی وەهایە كەوا سێ جۆر ( دار ) وڵات و جێگە هەیە یەكەم : دار الاسلام .

دووەم : دار الكفر داری مركب ( تێكەڵ ) بۆ ئەم بۆ چونەش خاكی ماردینی كردوە بە بەڵگە لەو جۆرە بوو لە كاتەدا بەڵام ئەوەی كە بۆ چوونی ( جمهوری ) زانایانی لە سەرە لەم بارەیەوە ئەوەیە كە جۆری شوێن و جێگەكان تەنها دوو جۆرن سێهەمیان نییە رەئی راجح ئەوەیە دوو دارە و سێهەم نییە .

**جۆرەكانی دیار ولّات**

**1- دار اسلام _ ولّاتی موسولمانان .**

**2- دارالكفر _ ولّاتی بێباوەران .**

**یەكەم / دار إسلام :** ئەوجۆرەیە كە یاساكانی ئیسلام تێیدا بالّا دەستە و دادوەری پێدەكرێت . ئەم جۆرە ولّاتە خەلّكەكەی حوكمی موسولّمانیان هەیە واتە بە موسولّمان حساب دەكرێن لە بنەرەتدا .

**جەند** **تێبینیەك**

**تێبینی یەكەم :** لەم جۆرە ولّاتەدا لێپرسینەوە لەگەلّ هەلّگەڕاوە لە دین (مورتەد) دا دەكرێت و سزا دەدرێت هەر جەندە جۆری لە ئاین دەرچونەكەی مغلظە بێت یان مجردة بێت .

كوفری مغلظە ئەو كوفرەیەكە زیانی بۆ كەسەكە خوی وغەیری خۆشی هەیە بەلّام كوفری مجردة تەنها زیانی بۆ خۆی هەیە ، وە جیاوازیەكەشیان ئەوەیە .

**یەكەم /** كوفری مغلظە تەوبە و پەشیمانی لێوەر ناگیرێت مەگەر كاتێك لە پێش ئەوە دابێت كە موسولّمانان دەستیان بیكاتی بەلگەش لەسەر ئەمە پەروەردگارمان لە سورەتی ( المائدة ئایەتی 34)دەفەرموویّت:

( بێجگە لەوانەی تەوبەیان كردوە لە پێش ئەوەی دەسەلّاتیان ببێت بەسەریاندا تا بزانن كە بە ڕاستی الله لێبوردە و میهرەبانە )

بەلّام كوفری مجردة تەوبە و پەشیمانی لە خاوەنەكەی وەردەگیرێت لە پێش و پاش ئەوەی موسولمانان دەسەلّاتیان هەبێت بە سەریدا .

**تێبینی دووەم :** لە جۆرە ولّاتە پەیمان بەستن (عهد ) لەگەلّ بێباوەران دەكرێت لێیان وەردەگیرێت بەبێ ئەوەی مۆلّەتیش لە پێشەوای موسولّمانان وەربگیرێت وە ئەگەر چی ئەو كەسەی پەیمانەكە دەدات بەبێ باوەڕەكە ئافرە ت بێت یان عبد بێت بەلّگەش لەسەرئەمە لە سەنەدی ئیمامی النسائی بە سەلمێنراوی هاتووە كە وا پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دەفەرموویّت : ( موسولّمانان خوێنیان یەكسانە كەم ترینی ناویان دە توانی كەسێكی بێباوەڕ بگرێتە خۆی ) .

هەروەها بە سەلمێنراوی هاتووە کە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دەفەرموویێت :

( پەنامان دا ئەو کەسەی تۆ پەنات دا دایکی هانی ) ئیمامی موسلیم گێراویەتەوە .

**تێبینی سێ یەم :** یاسای سزا جێبەجێ دەکرێت تێدا ( إقامة الحدود ) .

**تێبینی چوارەم :** بێویستە ( واجیبە ) لەسەر تەواوی موسوڵمانان کەوا کۆچ بکە ن بۆ ئەو وڵاتە بە کۆچکردنی سەرتا سەری .

ئەوە بەس بۆ خاکی موسوڵمانان دار اسلام .

## دار الكفر و بەشەکانی

**یەکەم دارالکفر :** ئەو وڵات و خاکەیە کە یاساکانی بێباوەڕی بەسەریدا زاڵە و کاری پێ دەکرێت .

**القاعدة شرعی :** لە بنەرەتدا وڵاتی بێباوەری بە وڵاتی شەڕکەر لەگەڵ وڵاتی موسوڵمانان دادەنرێت .

**لەم جۆرە وڵاتە ئەم بڕگانەی لەگەڵ پەیڕەو دەکرێت :**

أ- دانیشتوانەکەی حوکمی ئیسلامیان بەسەردا نادرێت .
ب- پەیمان لەگەڵی لە ناویدا نابەسترێت مەگەر بە ڕێگە پێدانی پێشەوای موسوڵمانان نەبێت .

ج- سەربڕاوی گۆشت و پەڵەوەر و ماڵاتیان ناخورێت مەگەر بە مەرج نەبێت .

د- یاسای جێبەجیکردنی سزا ئە نجام نادرێت ( اقامه الحدود) .

هـ- کۆچکردن بۆ ئەم جۆرە وڵاتە حە لاڵ و ڕێگەپێدراو نیە مەگەربە مەرج نەبێت .

## ( جۆرەکانی وڵاتی بێ باوەڕی )

أ- دار الكفرى الأمان : وڵاتی بێباوەڕی پەیمان و پەنادان و پاراستن .

ب- دارالكفرى خوف تغطف : وڵاتی بێباوەڕی ترس و فڕاندن .

ج- دارالكفرى عهد : وڵاتی بێباوەڕی پەیمان بەستن بۆ شەڕنەکردن .

د- دارالكفرى حرب : وڵاتی بێباوەڕی شەڕکەر لە دژی ئیسلام .

هـ- دارالكفرى ألاصلى : وڵاتی بێباوەڕی لە بنەڕەتەوە .

و- دارالكفرى طارء : وڵاتی بێباوەڕی کە بێباوەڕان دەستیان بەسەردا گرتووە .

1- دارالكفرى الأمان : ئەو جۆرە وڵاتە بێباوەڕیە کە موسوڵمان دەتوانێت لە ناویا بێ باوەڕبوون و بەری بوونی لە طاغوتان رابگەیەنێت هەروەها پابەند بێت بە دروشم و یاساکانی ئیسلام .

2- دارالكفرى خوف تغطف : ئەوجۆرە وڵاتەیە کە موسوڵمان ناتوانێت بێباوەڕبوونی و بەری بوونی لە طاغوتان رابگەیەنێت یاخود لە توانای نییە هەندێك لە دروشمەکانی ئیسلام جێبەجی بکات .

تێبینی : واجبە لەسەرموسوڵمانان کەوا کۆچ بکەن لە ( دارالكفرى خوف تخطف) بۆ ( دارالكفرى الأمان ) ئەگەرهاتوو وڵاتی ئیسلام نەبوو کۆچی بۆ بکات یاخود لە شوێنی خۆی ( جیهاد ) تێکۆشان لە پێناو الله تعالى نەبوو.

3- دارالكفرى عهد : ئەو جۆرە وڵاتە بێباوەڕیە کەوا لەگەڵ پێشەوای موسوڵمانان پەیمانی شەڕنەکردنیان بە ستووە هەروەك خاکی ( مەککە ) لە پێش پەیمان نامەی ( حودیبیە ) .

**تێبینی :** جیاوازی نێوان ( معاهد ) و ( الذمی ) و ( الاجارة ) ئەگەر چی هەر سێکیان لەسەر بێباوەڕی دەمێنەوە .

أ- **معاهد :** ئەو کەسەیە کەوا پەیمانی لەگەڵ دەکرێت بۆ شەڕ نەکردن بەڵام لە شوێن و وڵاتی خۆی دەمێنێتەوە .

ب- **الذمی :** ئەو کەسەیە کەوا پەیمانی پاراستنی پێدراوە لە خاکی موسوڵمانان دەژی .

ج- **الإجارة :** ئەو کەسەیە کە لە خاك و وڵاتی بێباوەڕانەوە هاتووە بۆ خاکی ئیسلام وە موسڵمانان پەیمانی پاراستنیان پێداوە .

4- **دارالکفر الحرب :** وڵاتی بێباوەڕی شەڕکەر لە دژی ئیسلام .

ئەم خاسیتە لە بنەڕەتدا لە خاسێتی جۆری وڵاتەکەیە کە بە شەڕکەر ئەژمار دەکرێت لە دژی ئیسلام و موسولمانان .
ئەو وڵاتەیە کەوا هیچ ڕێکەوتنێکی لەگەڵ نە بەستراوە و بەڵێنی پێنەدراوە لە لایەن موسوڵمانانەوە هەرووەك وڵاتانی ئێستا .

5- **دارالکفر ألاصلی :** وڵاتی بێباوەڕی لە بنەرەتەوە .

ئەو جۆرە وڵاتە بێباوەڕیە کەوا ڕۆژێك لە ڕۆژان بە یاسای دابەزێنراوی الله تعالی دادوەری تێدا نەکراوەوە هیچ کات موسوڵمانان ڕزگاریان نەکردوە لە دەستی بێباوەڕان .

**تێبینی :** لەگەڵ ئەم جۆرە وڵاتە ئەم یاسایانە جێبە جێ دەکرێت .

1-خەڵکەکەی لە بنەڕەتدا بە بێباور دادەنرێت ( کافر) وە مامەڵەیان لەگەڵ دەکرێت .
2-کۆچکردن بۆی ڕێگە پێدراو نییە .
3-سەربڕاوی لە گۆشت و ماڵات و پەلەوەر تێدا حەلال نییە مەگەر سەربراوی خاوەن کتێبەکانی پێشوو ( أهل الکتاب ) .
4-ژنیان مارە ناکرێ مەگەربە مەرج نەبێت .

**تێبینی :** یاساکانی مامەڵەکردن لەگەڵ خاوەن کتێبەکانی پێشوو ( أهل الكتاب ) .

1-پەیمان و بەڵێن پێدانیان لێ وەردەگیرێت و ڕێگە پێدراوە .
2-ڕێگە دراوە ژنیان مارە بکرێت .
3-سەربڕاوی گۆشت وماڵاتیان دەخورێت .
4-دەست گیراویان ( أسير ) دەکرێت بە ( فديه ) لە بەرامبەردا ئازاد بکرێت .

**وە پێشەوای موسوڵمانان دەتوانێت بە شەش 6 بڕیار و یاسا مامەڵەیان لەگەڵ بکات .**

1-کوشتن .
2-ئازاد کردن بە منەت و بێ بەرامبە ر .
3-ئازاد کردن لە بری پارەیەکی دیاری کراو .
4-وە ك بەندە مامەڵەی لەگەڵ بکرێت بکرێتە بەندە .
5-دەکرێت لە بەرامبەر کەسی تر لە موسوڵمانان ئازاد بکرێت .
6-سەرانە ( جزيه ) یان لێ وەربگیرێت .

6 **دارالكفری طارء :** ئەو وڵاتەیە کە موسوڵمانان ڕۆژێك لە ڕۆژان ڕزگاریان کردوە لە دەستی بێباوەڕان و بە یاسای دابەزێنراوی الله دادوەری تێدا کراوە لە پاشان بێباوەڕان دەستیان بە سەردا گرتووە و بە یاسای بێباوەڕی حوکمیان تێدا کردوە .

**تێبینی :** لەگەڵ ئەم جۆرە وڵاتی بێباوەڕیە بەم یاسایانە مامەڵەیان لەگەڵدا دەکرێت .

1-بڕیاری ( حكم ) لەسەرخەڵکەکەی دەدرێت لەسەر ڕواڵەت و ئەوەی لێوەیان ئاشکرا دەبێت ( ظاهر) .
2-کۆچ کردن ( هيجرة ) تێدا واجب دەبێت ئەگەر هاتوو تێکۆشان لە بێناو الله ی گەورەی تێدا نەبوو ( جیهاد ) .

لەم جۆرە وڵاتەی بێباوەڕی ( حكم ) بڕیاردان لەسەر لە ئاین هەڵگەڕاوەكانیان ( الردة ) بەم شێوەیە .

1-سەربڕاوی گۆشت و ماڵات و پەڵەوەریان ناخورێت ( حەرام ) لەم بارەیەوە ( ابن المنذر ) كۆڕای زانایانی ( اجماع العلماء ) هێناوەتەوە و باسی كردوە .
2-ئافرەتیان مارە ناكرێ ئەگەرلە دین هەڵگەڕاوەبن .
3-دەست گیراویان ( اسرهم ) لە بری هیچ شتێ ئازاد ناكرێت .

شێخی إسلام ( ابن تیمیة ) رەحمەتی الله ی لێبێت دەڵێت : لە دین هەڵگەڕاوە ئازاد ناكرێ نە لە بری پارە نە لە بری كە سی تردا .

لەم بارەیەوە فەرمودەی پێغەمبەر صلى الله علیه وسلم كردۆتە بەڵگە كە دەفەرمووێت :
( هەركەس لە ئاین هەڵگەڕاوە بیكوژن ) ئیمامی موسلیم گێڕاویەتیەوە .

4-بە هیچ شێوەیەك پەیمانیان لەگەڵ نابەسترێت و بەڵێنیان بێنادرێت .

وآخرو دعوانا أن الحمدلله رب العالمين.

